


# پێڕست









.....الْحَمْدُ للهِ الَّذِي لَهُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ الثَّرَى، عَالِمِ الْغَيْبِ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي السَّمَوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ، يَعْلَمُ سِرَّ خَلْقِهِ وَجَهْرَهُمْ، وَيَعْلَمُ مَا يَكْسِبُونَ، نَحْمَدُهُ بِجَمِيعِ مَحَامِدِهِ، وَنَصِفُهُ بِمَا وَصَفَ بِهِ نَفْسَهُ، وَوَصَفَهُ بِهِ الرَّسُولُ، فَهُوَ اللهُ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ، قَرِيبٌ، مُجِيبٌ، مُتَكَلِّمٌ قَائِلٌ، وشَاءٍ مُرِيدٌ، فَعَّالٌ لِمَا يُرِيدُ، الْأَوَّلُ قَبْلَ كِلِّ شَيْءٍ، وَالْآخِرُ بَعْدَ كِلِّ شَيْءٍ، لَهُ الْأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ وَلَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ تَبَارَكَ اللهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ، وَلَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى، يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ، يَقْبِضُ وَيَبْسُطُ، وَيَتَكَلَّمُ، وَيَرْضَى وَيَسْخَطُ، وَيَغْضَبُ، وَيُحِبُّ، وَيَبْغَضُ، وَيَكْرَهُ، وَيَضْحَكُ، وَيَأْمُرُ وَيَنْهَى، ذُو الْوَجْهِ الْكَرِيمِ، والسَّمْعِ السَّمِيعِ والْبَصَرِ الْبَصِيرِ، وَالْكَلامِ الْمُبِينِ، وَالْيَدَينِ وَالْقَبْضَتَينِ، وَالْقُدْرَةِ وَالسُّلْطَانِ وَالْعَظَمَةِ، وَالْعِلْمِ الْأَزَلِيِّ، لَمْ يَزَلْ كَذَلِكَ وَلَا يَزَالُ، اسْتَوَى عَلَى عَرْشِهَ فَبَانَ مِنْ خَلْقِهِ، لَا تَخْفَى عَلَيْهِ مِنْهُمْ خَافِيَةٌ، عِلْمُهُ بِهِمْ مُحِيطٌ، وَبَصَرُهُ فِيهِمْ نَافِذٌ، لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ، فَبِهَذَا الرَّبِ نُؤْمِنُ، وَإِيَّاهُ نَعْبُدُ، وَلَهُ نَصَّلِي وَنَسْجُدُ، فَمَنْ قَصَدَ بِعِبادَتِهِ إِلَى إِلَهٍ بِخِلافِ هَذِهِ الصِّفَاتِ، فَإِنَّمَا يَعْبُدُ غَيْرَ اللهِ، وَلَيْسِ مَعْبُودُهُ بِإِلَهٍ، كُفْرَانَهُ لَا غُفْرَانَهُ، فَنَشْهَدُ أَنَّ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهِ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدَهُ وَرَسُولَهُ، اصْطَفَاهُ لِوَحْيِهِ، وَانْتَجَبَهُ لِرَسَالَتِهِ، وَاخْتَارَهُ مِنْ خَلْقِهِ لِخَلْقِهِ فَأَنْزَلَ عَلَيْهِ كَلامَهُ الْمُبِينَ، وَكِتَابَهُ الْعَزِيزَ الَّذِي {لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ تَنْزِيلٌ مِنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ}.





# پێشەکیەك دەربارەی دوعا

..... دوعا ئەو عیبادەتەی تا باسی گرنگی و بەنرخی بکەین ئێشتا هەقمان نەداوە وەک پێویست، چەکی دەستی لاوازەکانە، ئومێدی بێ ئومێدەکانە، لابەری خەمی و خەفەتی غەمبارانە، دەوڵەمەندی فەقیرانە، بەربەستی قەدەرە تاڵەکانە، بزانە الله تعالى پێیخۆشە داوای لێبکەیت و دوعا بکەیت بۆیە بۆ ئەوشتانەی پێی نەبەخشیویت، دوعای کردوتە سەبەبی تا داوای بکەیت و پێت ببەخشێت، وە بزانە بەڵاو موسیەبتت بەسەر دەهێنێت لەبەر ئەوەی داوای لێبکەییت بپاڕێیتەوە لێی، بەڵام بە داخەوە زۆربەی بەندەکان بێئاگان لەم عیبادەتە، کاتێک شتێکیان دەوێت نە دوعا دەکەن بۆی و کاتێکیش بەڵایەکیان لێ بەسەر دێت لەباتی گەڕانەوەو پاڕانەوە بێ ئومێد و کافر دەبن بەرامبەر بە الله، وە بزانە الله تعالى دوعای کردوەتە سەبەبی بە دەسهێنانی پێویستیەکانی دونیا و قیامەت وە کردویشیەتیە سەبەبی لابردنی هەموو نارەحەتیەکانی دونیا و قیامەت، ئەبێ کێ لەو کەسە موتەکەبیرتربێت کە وازی لە دوعا هێناوەو هیچ پێویستیەکی دونیا و قیامەتی بە پەروەردگاری نیە وباکی پێی نیە؟! الله تعالى هەرکاتێک بیەوێت بەندەکەی توشی خێر بکات و فەزڵ و بەخششێکی پێ عەطا









بکات، ئەوا فێری دوعای دەکات و پشوو درێژی و بەردەوامی پێدەبەخشێت لەسەر دوعا کردن، وای لێدەکات خەمی ئەم بەندەیە قبوڵ بونی دوعاکانی نیە چونکە یەقینی هەیە الله تعالی دوعای بەندەکانی وەڵام دەداتەوە، بەڵکوو هەموو خەمی ئەم بەندەیە ئەوەیە کە لە دوعا بێبەش بکرێت و دوعا نەکات، وای لێدەکات بۆ هەموو ئەو شتانەی دەیەوێت و ئامانجییێتی دوعا دەکات و داوا دەکات لە پەروەردگاری، وە هەر کاتێکیش الله تعالی بیەوێت نیعمەتەکانی لە بەندەکەی بگرێتەوە و توشی نارەحەتی ناخۆشی بکات ئەوا لە دوعا کردن و داواکردن دوری دەخاتەوە، بێ ئومێدی دەکات لە دوعاکردن و پاڕانەوە لیی، ئەی داتە دەست نەفسی خۆی و گومڕاو و سەرلێشێواوی دونیا و قیامەتی دەکات، وە دڵنیابە هەموو خۆشی و فەزڵ و خێرەکان بەرەو ڕوت دێن مادام تۆ وازت لە دوعاکرن نەهێناوەو بەردەوامیت، هەرکاتێکیش وازت لە دوعا کردن هێنا ئەوا چاوەڕێی هەموو نارەحەتی و ناخۆشی و بەڵایەک بکە چونکە دوعایە کە بەرگریکاری بەڵایە، بەردەوامیت لە دوعاکردن نیشانەی ڕاستی تەنها پشت بەستنتە بە الله تعالی، وازهێنانیشت لە دوعا کردن و پاڕانەوە لە پەروەردگار نیشانەی لوت بەرزی و موتەکەبیری و بێ هیوایتە بەرامبەری، با زۆری تاوانەکانت و کەم تەرخەمیت لە عیبادەتەکان نەبنە هۆکاری ئەوەی وازبهێنیت لە











دوعا کردن، چونکە دوعا چەکی ئیمانداره، ئەگەر واز لە چەک بهێنیت ئەی بەچی دەجەنگیت بەرامبەر شەیتان و نەفسی خراپەکار؟! وە بزانە یەقینیش لە دوعا کردن ئەوە نیە تۆ دوعا بکەیت و دوعاکانت گیرا ببێت و تۆش یەقینت بە الله تعالی هەبێت، بەڵکو یەقینی ڕاستەقینە بە الله تعالی ئەوەیە تۆ دوعا بکەیت بەڵام دەرگاکان هەر بە داخراوی بە ڕوودا بمێنێتەوە، تۆ هەر دوعا بکەیت کەچی هەر ناڕەحەتی و ناخۆشیت توش ببێت، تۆ هەر دوعا بکەیت و خەمەکانت زیاتر بن، لەسەروی هەموو ئەمانە تۆ دەڵێیت : ئەی پەروەردگارم تۆ چەن بە ڕەحمی!! دەبێ تۆ چ خێرێکت بۆمن دانابێت!؟ دوعاو پاڕانەوەکان پشتی هەموو مەحاڵەکان دەشکێنێت تەنها یەقینت بە ﷲ هەبێت، بۆ هەموو ئەو خەم و ناڕەحەتیانەی تێی کەوتویت، بۆ ئەو شتانەی کە حەزی پێدەکەیت و ئاواتی پێ دەخوازیت و ئامانجتە، تەنها و تەنها دەست بگرە بە دوعاوە وەک ئەوەی هیچ چارەسەرێک شک نەبەیت تەنها ئەو نەبێت، ئەگەر الله تعالی دوعای پێبەخشیت دڵنیابە ئەیەوێت نیعمەتەکانی خۆیت بەسەردا بڕژێت، وە ئەگەر لەدوعاش مەحرومی کردیت ئەوە دڵنیابە لە هەموو نیعمەتەکان مەحرومی کردویت، هەموو کەس دڵی ناچێتە سەر دوعا، هەر کاتێک دڵ و زمانت بەیەکەوە چوە سەر دوعا ئەوا دڵنیابە الله دەیەوێت پێت ببەخشێت، وە یەکێک









لەگەورەترین سزاکانی الله بۆ بەندەکەی دوورخسنەوەیەتی لە دوعا کردن، هەرکاتێک ئەوەی لێسەندەوە سەرو بنی ژیانی لێ تێک دەچێت، دڵی بەرەوە لە ناوچون دەچێت و هەستیشی پێ ناکات ، ئیدی ئەوکات چارەسەرێک نامێنێ بۆ ئەو کێشە گەورەیە چونکە زۆرینەی شتەکان بە دوعا کردن چارەسەر دەبن ئەویش چارەسەرەکەی لە ژێر دەست دەرکراوە.









# بابێك دەربارەی دوعا

{وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ}

الله تعالى لە فەرموودەیەكی قودسیدا دەفەرمووێت :

ئەی بەندەكانم، هەمووتان گومڕان ئیلا ئەوە نەبێت كە من هیدایەتم داوە، داوای هیدایەتم لێبكەن هیدایەتان دەدەم,

ئەی بەندەكانم، هەمووتان برسین ئیلا ئەوە نەبێت كە من تێرم كردوە، داوای خواردنم لێبكەن پێتان دەبەخشم,

ئەی بەندەكانم، هەمووتان ڕوتن ئیلا ئەوە نەبێت كە من پۆشتەم كردوە، داوای پۆشتە كردنم لێبكەن پۆشتەتان دەكەم,

ئەی بەندەكانم، ئێوە بەشەو بە ڕۆژ تاوان دەكەن وە منیش لە هەموو تاوانەكان خۆش دەبم، داوای لێخۆشبونم لێبكەن لێتان خۆش دەبم,

[ رواه المسلم ٢٥٧٧ ]

لەم فەرموودە قودسیەدا گرنگی دوعامان بۆ دەردەكەوێت، كە هۆكاری سەرەكەی بە دەستهێنانی هەموو خێر و چاكەكانی دونیا و قیامەتە، وە گرنگی داواكردنی هیدایەتمان بۆ دەردەكەوێت كە دەبێت موسڵمان پێش داواكردنی هەموو ئەو شتانەی كە دەیەوێت داوای هیدایەت بكات چونكە ئەوە گەورەترینی خێرەكانە كە الله تعالى بیدات بەبەندەكەی.











رسول الله ﷺ دەفەرمووێت : ئەگەر یەكێك لە ئێوە دوعای كرد با پێداگری بكات لە دوعا كردنەكەی دا,وە نەڵێت : اللهم ئەگەر دەتەوێ ئەوا پێم ببەخشە,چونكە الله زۆر لێكەری نی یە.

[ رواه المسلم ٢٦٧٨ ]

واتە لەكاتی دوعا كردندا مەڵێ إن شاءالله

رسول الله ﷺ دەفەرمووێت : دووعا لەخۆتان مەكەن ،جگە لە دووعای خێر ، چونكە بەڕاستی مەلائیكەتەكان ئامین دەكەن لەوەی داوای دەكەن.

[ رواه المسلم ٩٢٠ ]

رسول الله ﷺ دەفەرمووێت : دووعا لە خۆتان مەكەن وە دوعا لە منداڵەكانتان مەكەن وە دوعا لە ماڵتان مەكەن نەوەک لە كاتێكدا دوعا بكەن كە الله پێویستەیەكانی تێدا ببەخشێت، وە وەڵامتان بدرێتەوە.

[ رواه المسلم ٣٠٠٩ ]











سلمان الفارسي دەڵێت : الله تعالى بەشەرم و بەڕێزە ، شەرم ئەكات لەبەندەكەی كەدەستەكانی بەرز بكاتەوە بۆلای دوعا بكات ، پاشان بەبێ هیوایی و دەست بەتاڵی بیگێرێتەوە.

[ كتاب الزهد للحافظ وكيع بن الجراح ٥٠٤ ]

الصبغي دەڵێت : له خەومدا عمر بن الخطاب رضي الله عنه م بینی، پێم وت : دەرچوون و ڕێگای دەرباز بوون له دونیا چیه؟ فەرمووی : دوعاو پاڕانەوە.

[ سير أعلام النبلاء ١٥/٤٨٥ ]

مطرف كوڕی عبدالله دەڵێت : بیرم كردەوە چی كۆكەرەوەی هەموو خێرەكانە، له كاتێكدا خێرەكان زۆرن، ڕۆژوو و نوێژ وە له كاتێكدا ئەوانە لەدەستی الله دان عز وجل، وە تۆ توانات نییه بەسەر شتێكدا كه لەدەست الله دا بێت ئیلا مەگەر داوای لێ بكەیت ئەویش پێت ببەخشێت كەواتە كۆكەرەوی هەموو خێرەكان دوعا و پاڕانەوەیه.

[ الزهد لأحمد بن حنبل١٣٤٤ ]









ابی دەرداء رضی الله عنه دەڵێت : بەندەی موسڵمان الله تعالی لێیخۆش دەبێت لە کاتێکیشدا کە خەوتوە، وتیان ئەوە چۆن ئەبێت ئەی ابا دەرداء؟

فەرمووی: براکەی شەو هەڵدەستێت عیبادەتی زۆر دەکات و پاشان دوعای بۆ دەکات لێی قبوڵ دەکرێت، دوعا بۆ باوکی دەکات لێی قبوڵ دەکرێت.

[ الزهد لأحمد بن حنبل ٢٦٤ ]

{فَإِذَا فَرَغْتَ فَانْصَبْ} [الشرح ٧ ]

ابن عباس دەڵێت : کاتێک تەواو بویت لە نوێژکردن، خۆت ماندوو بکە بە دوعا کردنەوە، وە داوا لە الله بکە و ئومێدت پێی هەبێت.

[ تفسیر الطبری ]

ابن عباس دەڵێت : خۆپاراستن لە قەدەردا هیچ سوودێکی نیە، بەڵام الله تعالی چەندی بوێت بە دوعا لەقەدەر دەسڕێتەوە.

[ المستدرک ٣٣٣٣ ]









ئیمامی الاجری دەڵێت : هەرکەسێک الله تعالی خێری بۆی بوێت، دەرگای دوعا و پاڕانەوەی بۆ دەکاتەوە، هانا بۆ الله دەبات، لە ئایینەکەی دەترسێت، زوبانی دەپارێزێت، زەمەنی خۆی دەناسێت.

[ الشريعة الاجری ]

پرسیار کرا لە مالك كوڕی أنس : لەبارەی پیاوێکەوە کە دوعا دەکات و دەڵێت : {یا سیدی} ئەی گەورەم؟ فەرمووی: من پێم خۆشە دوعا بکەم بە دوعای پێغەمبەران {ربنا،ربنا}.

[ الحلية الاولياء ]

مالك دەڵێت : موحەممەدی کوڕی عبد الرحمن کوڕی یەزید خێزانێکی چاکەکاری هەبوو، دەبینی خوای گەورە بە نسیبی نەکردووە تەنها بە دوعا نەبێت

[ طبقات ابن سعد ١٠٤٦٤ ]

ابراهيم الحربي دەڵێت: دوعای دایک و باوک بۆ منداڵەکەی وەک دوعای پێغەمبەرێکە بۆ ئوممەتەکەی.

[ الفوائد المنتخبة لابن بشكوال ٦١٤ ]









مجاهد دەڵێت : دوعای باوک هیچ پەردەیەک نیە ببێتە ڕێگری لەلای الله عزوجل.

[ البر والصلة للمروزي ٥٠ ]

رسول‌الله ﷺ دەفەرموویت : هەر کاتێک ئینسان مرد لە کردەوەکانی دادەبڕێت ئیللا لە سێ شت نەبێت : خێرێکی بەردەوامی لەدوای خۆی بەجێ هێشتبێت، یان زانستێکی بەسوود خەڵکی کاری پێ بکەن، یان منداڵێکی صاڵح لەدوای خۆی دوعای بۆ بکات .

[ رواه مسلم ١٦٣١ ]

سعید کوڕی مسیب دەڵێت : بەندە پلەی بەرز دەبیتەوە -لە دوارۆژ- بەهۆی دوعای مناڵەکەیەوە

[ ابن أبي الدنيا في مكارم الأخلاق ٢١٤ ]

أبو هريرة دەڵێت : ڕەزیلترین و چروکترینی خەڵکی ئەو کەسەیە لە سەلام کردن ڕەزیلە، وە لاوازترین و بێ تواناترینی خەڵکی ئەو کەسەیە کە بێ توانایە لە دوعا و نزا کردن.

[ الأدب المفرد للبخارى ١٠٤٥ ]





ئیمام الشافعي لە شعرێکیدا دەڵێت :

ئەوە گاڵتە بە دوعا دەکەی و لە ڕێزی کەم دەکەیتەوە
جا تـۆ کوا ئاگات لەوەیە کە دوعا چ شتێکی کـردووە؟!

تیرەکانی شــەو-یەعنی دوعا- دەیپێکن و هەڵەناکەن بەڵام
ماوەیەکـــیان بۆ هەیە، وە بۆ ماوەش کۆتایی هەیــە.

[ ديوان الشافعي ]

ئوبەی کوڕی کعب دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ گەر دوعای بۆ کەسێک بکردایە سەرەتا لەخۆیەوە دەستی پێ دەکرد ڕۆژێک باسی موسى عليه السلام کرد فەرمووی: ڕەحمەتی الله لەئێمە و لەموسى بێ گەر ئارامی بگرتایە ئەوە الله تعالی هەواڵی ئەوی بۆمان باس ئەکرد.

[ المصنف لابن أبي شيبة ٣١١٨٧ ]

سعيد کوڕی يسار دەڵێت : لەلای ابن عمر دانیشتم باسی پیاوێکم کرد ڕەحمەتم بۆ نارد، دای بەسینگمدا فەرمووی لەخۆتەوە دەست پێبکە .

[ المصنف لابن أبي شيبة ٣١١٩٠ ]





إبراهيم النخعي دەڵێت : دەوترا گەر دوعات کرد لەخۆتەوە دەست پێبکە، چونکە تۆ نازانی کام دوعات گیرا ئەبێت.

[ المصنف لابن أبي شيبة ٣١١٨٨ ]

عقبة بن عبد الغافر دەڵێت : دوعایەک لە نهێنیدا زۆر باشترە لە حەفتا دوعا لە ئاشکرادا.

[ تفسير يحيى بن سلام ]

حذيفة دەڵێت : سەردەمێک دێت بەسەر خەڵکیدا هیچ کەس تێیدا ڕزگاری نابێت ئیلا ئەو کەسە نەبێت کە دوعا دەکات بەهاوشێوەی دوعای مەسی نوقم بوو لەئاودا .

[ مصنف ابن أبي شيبة ٣٨٣٠١ ]









## بابێك دەربارەی حاڵی سەلەف لەگەڵ دوعا

عبدالله کوڕی مسعود دەڵێت : داوای بەخشش {فەزڵ} بکەن لە الله، چونکە الله تعالی پێی خۆشە داوای لێبکرێت.

[ رواه الترمذي ]

پیاوێک هات بۆلای ئیمامی أحمد کوڕی أبی غالب الحربی پێی فەرموو: ئەی ئیمام وەرە لەگەڵم با بڕۆین بۆلای ئەمیر تکام بۆ بکە تا ئەو پێویستیەی کە ئەمەوێت بمداتێ، ئیمامی الحربی پێی فەرموو: هەستە لەگەڵم دوو ڕکات نوێژ بکەو لە الله تعالی داوابکە، ئەی کوڕەکەم من درگایەک کە کراوەیە وازلێناهێنم و بڕۆم بۆ درگایەک کەداخراوە!!

[ ذيل طبقات الحنابله ]

رسول الله ﷺ دەفەرمووێت : هیچ بەندەیەکی موسوڵمان نیە لە پەنهانی ـدا بۆ دوعا بۆ براکەی بکات ئیلا فریشتەیەک دەڵێت : ئەوەندەش بۆ تۆ.

[ رواه المسلم ٢٧٣٢ ]









خوشک و براکانتان لە دوعا بێبەش مەکەن چونکە هاوشێوەی دوعات بۆ ئەوان بۆ تۆشە بۆیە دوعا زۆر بۆخۆتان بکەن.

أبي الدرداء دەڵێت : من دوعا دەکەم بۆ حەفتا دانە لەبراکانم لە سوجدەدا، ناویان دەبەم بەناوەکانی خۆیان.

[ مصنف ابن ابی شیبه ]

ئیمامی أحمد دەڵێت : ماوەی چل ساڵە هیچ نوێژێکم نەکردوە ئیلا لەناو نوێژکەم دا دوعام کردوە بۆ شافعی رحمه اللّٰه.

[ الانتقاء فی فضائل الثلاثه ٧٦ ]

أبو بكر الصديق دەڵێت : دوعای برا بۆ براموسوڵمانەکەی لە پێناو الله وەردەگیرێت و جواب دەدرێتەوە.

[ زوائد عبد اللّٰه بن أحمد على الزهد ٥٧٥ ]

أبو عبد الرحمن الحبلي دەڵێت : سەد برام هەیە لە پیناو الله، بۆ هەموویان دوعا و نزا ئەکەم و دانە بە دانە ناویان ئەهێنم.

[ الجامع لابن وهب ٢٣٥ ]









أم الرداء دەڵێت : أبو الدرداء ٣٦٠ هاوڕێی هەبوو لە پێناو الله، لە نوێژەکاندا دوعای بۆ دەکردن ، منیش لێم پرسی لەو بارەیەوە، فەرمووی : هیچ کەسێ نییە کە بە پەنهان دوعا بۆ براکەی بکات ئیلا دوو مەلائیکەت دەڵێن : بۆتۆش بەهەمان شێوە، ئەی حەزنەکەم مەلائیکەت دوعام بۆ بکەن ؟!.

[ سير أعلام النبلاء ]

أبی عبدالله کوڕی خطیب دەڵێت : أبی حمدون لاپەڕەیەکی هەبوو کە تێیدا ناوی سێ سەد لە هاوڕێکانی نوسرابوو، جا هەموو شەوێک دوعای بۆ دەکردن، شەوێک خەوی لێکەوت و نەیکرد، جا لە خەوەکەی پێی وترا: ئەی أبا حمدون بۆچی ڕوناکیەکەت دانەگیرساندوە ئەمشەو، باوکی عبداللە دەڵێت: جا هەستا و ڕوناکیەکەی داگیرساند، وە لاپەڕەکەی هەڵگرت و دوعای بۆ یەکە بە یەکەیانی کرد تاوەکو تەواو بوو.

[ تاريخ بغداد ٤٩٣/١٠ ]









بۆ ئیمام أحمد : باسی عامر کوڕی عبداللە کوڕی الزبیر کوڕی العوام رضي الله عنهم کرا؟، فەرمووی: بخ بخ، بەڕاستی چاکەکار و خواپەرست بوو، لە ئەوەوە پێمگەشتووە کە وتوویەتی: ماوەی ساڵێک داوای هیچ پێویستیەکم لە الله عزوجل نەکردوە بۆخۆم، ئیلا دوعام بۆ باوکم کردوە، وە ئیمام أحمد فەرمووی : وەفاتی کرد و سەرقاڵ بوو بە دوعاکردن بۆ باوکی.

[ زاد المسافر - ٤/ ٥٤٤ ]

عروة کوڕی زبیر : پیاوێکی بینی نوێژی دەکرد، پیاوەکە زوو نوێژەکەی تەواو کرد، عروة بانگی کرد و پێی وت : ئایا تۆ هیچ پێویستیەک و داواکاریەکت لەپەروردگار نیە؟ من لەکاتی نوێژ کردن ئەوەندە لەپەروەردگارم دەپاڕێمەوە و دوعا دەکەم هەتا داوای خوێشی لێدەکەم.!

[ صفة صفوة ٢/٤٥٧ ]









عمر کوڕی خطاب : تەوافی دەکرد بە دەوری کەعبەدا دەیفەرموو :

اللهم ئەگەر تۆ نوسیوتە لەسەرم بەدبەختی یان تاوان، بیسڕەوە چونکە بەڕاستی تۆ ئەوەی ویستت لێبێت دەیسڕیتەوە و ئەوەی ویستت لێبێت جێگیری دەکەیت سەرچاوەی هەموو کتێب وبڕیارەکان لای تۆیە، بمگێڕە لە خۆشبەختان و لێخۆشبوان.

[ الدر المنثور ]

تابعی سلمة کوڕی دینار دەڵێت : لێم قەدەغە بکرێت و نەتوانم دوعا بکەم زۆر زیاتر دەترسم وەک لەوەی وەڵامی دوعاکانم نەدرێتەوە.

[ الحلية الاولياء ٣/٢٤١ ]

{وَلَمْ أَكُن بِدُعَائِكَ رَبِّ شَقِيًّا} [مريم ٤]

سفیان کوڕی عیینة دەڵێت : دڵخۆشم بە دوعا کردن و داواکردن لێت، ئەگەر چی پێشم نەبەخشیت.

[ تفسير ابن ابى حاتم ١٣٠٣٣ ]









سلمان الفارسی دەڵێت : کاتێک پەروەردگار ئادەمی درووست کرد فەرمووی: شتێک بۆمن وە شتێک بۆ تۆ، وە شتێک لە نێوانی من و تۆ، جا ئەوەی کە بۆ منە ئەوەیە کە بمپەرستی و هاوەڵ و شەریکم بۆ پەیدا نەکەیت، وە ئەوەی کە بۆ تۆیە ئەوەیە کە هەرچی کردەوەیەک بکەیت پاداشتت ئەدەمەوە لەسەری، وە ئەوەی کە لە نێوان و من و تۆدایە ئەوەیە کە داواکردن و دوعا لەتۆ وە و لەمنیش وەڵامدانەوە.

[ المصنف ابن ابی شیبة ٣٧٣٨١ ]

خالد کوڕی صفوان دەڵێت : بترسن و خۆتان بپارێزن لە مەنجەنیقی کەسە لاوازەکان- مەبەستی پێی دوعا بوو-.

[ البيان والتبيين ١/٣٥٢ ]

پیاوێک بە طاووسی وت : دوعام بۆ بکە ، فەرمووی : ئێستا نیەتم نیە دوعا بکەم بۆ ئەوەی لە خوا نزیک ببمەوە بەڵکو لەبەر داواکاریەکەی تۆ دەیکەم.

[ ابن سعد في الطبقات ٨١٩٢ ]









عبدالله کوڕی عمر : قورئانی دەخوێند کاتێک دەڕۆی بەلای ئەو ئایەتانەی باسی بەهەشت بوو دەوەستاو داوای بەهەشتی لە الله تعالی دەکردو دوعای دەکردو دەگریا، وە کاتێک دەڕۆی بەلای ئەو ئایەتانەی باسی ئاگر بوو دەوەستاو دوعای دەکرد و پەنای دەگرت بە الله عزوجل لێی.

[ الزهد لإمام أحمد ١٠٨٢ ]

معاوية کوڕی قرة دوعای دەکرد و دەیفەرموو : اللهم تۆ پیاو چاکانت چاک کردوەو ڕزقت داون بەوەی کاروکردەوە بە طاعەتی تۆ بکەن و لێیان ڕازیبیت، اللهم وەک چۆن ئەوانت چاک کردوەو ڕزقت داون و لێیان ڕازیبویت، ڕزقی ئێمەش بدەیت کاروکردەوە بە طاعەتی تۆ بکەین و لێمان ڕازیبیت.

[ تاريخ دمشق ]

التابعي أبو العالية دەڵێت : زۆر لە عمری کوڕی خطابم دەبیست دەیفەرموو : اللهم عافنا واعف عنا .

اللهم، سەلامەتم بکەیت و لێم خۆش بیت.

[ الزهد لأحمد ٦١٧ ]









عبدالله کوڕی عمر : کاتێک لەسەر کێوی صەفا بوو دووعای ئەکرد و ئەیوت : یا الله تۆ وتت کە داوام لێ بکەن وەڵامتان ئەدەمەوە، وە تۆ لە بەڵێنی خۆت لانادەیت، وە منیش داوات لێ ئەکەم وەک چۆن هیدایەتت دام بۆ ئیسلام لێم نەسێنیت هەتا ئەممرێنیت بە موسوڵمانی .

[ الموطأ لإمام مالک ٣\٥٤٣ ]

أبو موسى الأشعري دەڵێت : لەگەڵ پێغەمبەر بوین ﷺ لەسەفەردا، خەڵکی دەنگیان بەرز دەکردەوە بە الله أکبر، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەی خەڵکینە لەسەر خۆتان بن- واتە سەوت بەرز مەکەنەوە-. ئێوە داوا لەیەکێک ناکەن کەڕ بێت و شاراوە بێت، ئێوە داوا لە یەکێک دەکەن بیسەرە و نزیکە- سمیعا قریبا-.

[ صحیح المسلم ٢٧٠٤ ]

ئیمامی مجاهد : پیاوێکی بینی کە لە کاتی دوعا کردندا دەنگی بەرز دەکردەوە بەرد وخۆڵی تێگرت.

[ المصنف لابن أبي شيبة ٧ /١٠٩ ]









الحسن البصری دەڵێت : ئەوان خۆیان زۆر ماندوو دەکرد لە دوعا کردندا وە گوێت لە هیچ شتێک نەدەبوو ئیللا چرپە نەبێت .

[ المصنف لابن أبي شيبة ٧/١٠٩ ]

المفضل کوڕی فضالة : کاتێک نوێژی عەسری دەکرد لە ڕۆژی جومعەدا بەتەنیا لە گۆشەیەکی مزگەوت دادەنیشت و هەر دوعای دەکرد تاکو ڕۆژ ئاوا دەبوو.

[ أخبار القضاة ٣/٢٣٨ ]

محمد کوڕی الولید دەڵێت : عمری کوڕی عبدالعزیز بەلای پیاوێکدا تێپەربوو کە دارێکی لەدەست بوو یاری پێدەکرد وە دەیووت : اللهم حور العين پێ ببەخشە، عمر بۆی چوو پێی ووت : چەندە قسەکارێکی خراپی تۆ ، ئایە دارەکەت فڕێنادەیتوو ئیخلاصت هەبێ بۆ الله لە دوعا و پاڕانەوەتدا .

[ موسوعة ابن أبي الدنيا ]









ابن أبی رواد دەڵێت: طاوس و هاوەڵەكانی كاتێ نوێژی عصرـیان دەكرد ڕویان لە قیبلە ئەكرد. وە قسەیان لەگەڵ هیچ كەسێك نەئەكرد. سەرقاڵ ئەبوون بە دوعا و پاڕانەوە.

[ الزهد لأحمد بن حنبل ٢٢٠٩ ]

پێغەمبەر موسی علیە السلام : لە دوعا و پاڕانەوەكانیدا دەیفەرموو: ئەی پەروەردگار دڵم نەرم بكە بە تەوبە كردن، وە دڵم وەک بەرد ڕەق مەكە.

[ الزهد لأحمد بن حنبل ]

نافع مەولای ابن عمر دەڵێت : ابن عمر شەوی زیندوو ئەكردوە بە شەو نوێژ، جا ئەیوت: ئەی نافع ئایە كاتی سەحەر داهات؟ ئەموت: نەخێر، دووبارە نوێژی ئەكردەوە. گەر بموتبوایە: بەڵی، دائەنیشت و دوعای ئەكرد و داوای لێخۆشبونی ئەكرد تاوەكو نوێژی بەیانی.

[ تفسیر ابن أبي حاتم ٣٣٠٢ ]









وهب کوڕی منبه دەڵێت : پیاوێک هەبوو زەمانێک پەرستشتی دەکرد، جا پێویستیەکی بۆ دروست بوو لای پەروەردگار، ٧٠ شەمە بەڕۆژوو بوو، لە هەموو شەمەیێک ١١ دنکە خورمای ئەخوارد، پاشان داوای پێویستیکەی لە پەروەردگار کرد، بەڵام پێی نەبەخشرا، جا لۆمەی نەفسی کرد و وتی: ئەمە بەهۆی تۆوەیە، گەر خێرت هەبوایە ئەوا پێت دەبەخشرا، جا لەم کاتەدا فریشتەیەک بۆی دابەزی و فەرمووی: ئەی نەوەی ئادەم ئەم کاتەت چاکتر بوو لەو پەرستشەی پێشووت، وە پەروەردگار پێویستیەکەتی پێ بەخشی.

[ مجموع الرسائل لابن رجب ]

عبد الله کوڕی مسعود : لەگەڵ ئەو فەزڵ و کردەوە چاکانەی کە کەس ناتوانێت بیژمێرێت ئیلا الله نەبێت، لەهەمان کاتدا دوعای دەکرد و دەیفەرموو : ئەی پەروەردگارم بمخەرە بەهەشتەوە بە فەزڵ و منەت و ڕەحمەتی خۆت.

[ الطبراني في الكبير ٨٩١٨ ]







## بابێك دەربارەی كاتەكانی قبوڵبونی دوعا

رسول اللّٰه ﷺ دەفەرموویێت : نزیکترین کات کە بەندە لە پەروەردگاری خۆی نزیک بێت ئەو کاتەیە کە لە سوژدە دا بێت, لەو کاتەدا زۆر دوعا بکەن.

[ رواه المسلم ٤٨٢ ]

رسول اللّٰه ﷺ دەفەرموویێت : پەروەردگارمان تبارک وتعالی هەموو شەوێک دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا کاتێک سێ یەکی کۆتایی شەو دەمێنێت

دەفەرموێت: کێ دوعا دەکات تا وەڵامی بدەمەوە؟

کێ داوام لێ دەکات با پێی ببەخشم؟

کێ داوای لێ خۆش بوونم لێ دەکات

با لێی خۆش بم؟

[ متفق علیه ]









رسول الله ﷺ دەفەرموویێت : هەموو شەوێک کاتێ سێیەکی شەو تێدەپەڕێت، الله دادەبەزێتە ئاسمانی یەکەمی دونیاو دەفەرموێت: من پادشام، من پادشام، کێ داوام لێدەکات با وەڵامی بدەمەوە؟ کێ داواکاریی هەیە لێم تا پێی ببەخشم؟ کێ داوای لێخۆشبوونم لێدەکات تالێی خۆشبم، هەر بەوشێوەیە دەبێ هەتا بەرەبەیان ڕووندەبێتەوە.

[ رواه المسلم والبخاري ]

جابر دەڵێت : بیستم پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: لەشەودا کاتێک هەیە هیچ پیاوێکی موسوڵمان ڕێکەوتی ناکات لەکاتێکا لە الله دەپارێتەوە بۆ کاری خێری دونیاو قیامەت ئەوا ئیلا داواکاریەکەی پێ دەبەخشێت، ئەو کاتەش لەهەموو شەوێکدا هەیە .

[ رواه المسلم ٧٥٧ ]







موسى کوڕی عیسى دەڵێت : قەرز دانەوەم لەسەر قورس ببوو، گەیشتم بە بشر پێم ووت: قەرزم لەسەر قورس بووە، پێمی گووت: پەیوەست بە بە سێیەکی شەوەوە، وە چومە لای أحمد بن حنبل و پێم ووت: قەرزم لەسەر قورس بووە، پێمی گووت: پەیوەست بە بە سێیەکی شەوەوە-مەبەستی دوعا بوە لەو کاتەدا-.

[ التوكل للقاضي أبي يعلى ٦٤ ]

بۆیە ئەگەر تۆی موسڵمان پێویستیەکت هەیە یان کارێکت لەسەر قورس بوە و دڵت وێران بوە و ئەتەوێ دوعاکانت گیرابن، ئەوا پەیوەستبە بە سێیەکی شەوەوەو لە کاتی سەحەردا دوعاکانت بکە.

رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێت : بەڕاستی لە ڕۆژی هەینیدا سەعاتێک - کاتێک- هەیە، هیچ بەندەیەکی موسوڵمان ڕێکەوتی ناکات وەستابێت و تێیدا نوێژ بکات، وە داوای خێر لە الله بکات، ئەوا ئیلا- الله تعالى - پێی دەبەخشێت.

[ رواه البخاري ٥٢٩٤ ]







ئیمامی أحمد دەربارەی ئەو سەعاتی ڕۆژی جومعە دەڵێت :

زۆرینەی فەرموودەکان لەسەر ئەوەن کە

لە دوای عەصرە .

إسحاق دەڵێت : دوای عەصرە، هیچ گومانی تێدا نییە.

[ مسائل للكوسج ]

ئیمامی طاوس : کاتێک نوێژی عەصری دەکرد لە ڕۆژی هەینیدا، ڕووی دەکردە قیبلەو قسەی لەگەڵ کەس نەئەکرد هەتا خۆر ئاوا ئەبوو-سەرقاڵ ئەبوو بە دوعا کردن-.

[ تاريخ واسط ]

یزیدی کوڕی هارون دەڵێت : محمدـی کوڕی یزیدـ الواسطي م دوای مردنی لە خەونمدا بینیم و پێم وت : الله چی لێکردی؟ فەرمووی : لێم خۆشبوو، ووتم : بەهۆی چی؟ فەرمووی : بەهۆی دانیشتنێکەوە کە أبو عمرو البصري دانیشتبوو لامان لە ڕۆژی جومعەدا دوای عصر، پاشان دوعای کرد و ئێمەش آمین ـمان کرد ، جا -الله- لێمان خۆشبوو

[ تأريخ بغداد للخطيب ]









أبو سلمة كوڕی عبدالرحمن دەڵێت : كۆمەڵێک لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ كۆبوونەوە، باسی ئەو كاتەیان كرد كە لەڕۆژی جومعەدایە، پاشان یەكتریان جێهێشت و هیچ جیاوازیان نەبوو كە -كاتی دوعا گیرابوون- كۆتا كاتی ڕۆژی جومعەیە.

[ الأوسط للإمام إبن المنذر ]

ئیمامی أحمد دەڵێت : زۆربەی ئەو فەرموودانەی كە هاتون لەسەر ئەو سەعاتەی ئاخیر{لە ڕۆژی جومعەدا} كە دوعای تێدا قەبوڵە، ئەوە دوای عەسرە، وە من ئومێدم وایە كە دوای خۆر ئاوابونە.

[ سنن الترمذی ]

هەر لەبەر گرنگی ئەم سەعاتەیە وتراوە

لا تبكي الميت إذا مات
وابكي عصر الجمعة إذا فات..

مەگری بۆ مردوو كاتێک مرد
بگری بۆ عەسری جومعە كاتێک لەدەستت چوو..











كعب الأحبار : سوێندی خوارد بەوەی كە ڕوباری بۆ موسا شەق كرد، كە لەتەواراتدا هاتوە پەروەردگار وەڵامی بەندەكەی دەداتەوە لەكاتی باران بارینددا، وە وەڵامی دەداتەوە لەكاتی سەحەردا-بەرەبەیان-، وە وەڵامی دەداتەوە لەكاتی ڕۆژوو شكاندندا، وە لەكاتی سەحەردا-بەرەبەیان- درگاكانی ئاسمان دەكرێنەوە بۆ هەموو دوعا كارێك و داوا كارێك، ئەوەی كە ئومێدی هەیە یان ئەوەی كە دەترسێت.

[ الجامع لابن وهب ١١٢٢ ]

عبد الله كوڕی عمر : فەرمانی دەكرد بە دوعا كردن لە كاتی بانگ دانی بانگ بێژەكان.

[ مصنف ابن ابی شیبه ٢٩٢٤٣ ]

عبد الله كوڕی عمر رضی الله عنه دەڵێت : پێنج شەو دوعا تێیدا ڕەتناكرێتەوە : شەوی جومعە، وە یەكەم شەوی مانگی ڕەجەب، وە شەوی نیوەی شەعبان، وە شەوی دوو جەژنەكە.

[ مصنف عبدالرزاق ٧٩٢٧ ]









ئیمامی شافعی دەڵێت : پێمان گەیشتوە کە دوعا قبوڵ دەبیت لە پێنج شەودا : شەوی جومعە، شەوی جەژنی قوربان، وە شەوی جەژنی ڕەمەزان، وە یەکەم شەوی مانگی ڕەجەب، وە شەوی نیوەی شەعبان.

[ كتاب الأم ١/٢٦٤ ]

ئیمامی شافعی : فەرموودەیەکی مورسەلی مکحولی لە پێغەمبەرەوە ﷺ باسکرد دەربارەی قەبوڵبوونی دوعا لەکاتی باراندا

پاشان فەرمووی : لەبەرم کردووە لە زیاد لە کەسێک - لە پێشینان - داوای قەبوڵکردنی دوعا لە کاتی دابەزینی باران و بەرپاکردنی نوێژدا.

[ كتاب الأم ]

ئیمامی الشعبي دەڵێت : کاتێک لە تەحیات تەواو بووی دوعا بۆ دوارۆژ و دونیای خۆت بکە

[ المصنف ابن أبي شيبة ٣٠٤٤ ]

سهل کوڕی سعد الساعدی دەڵێت : دوو کات هەن دەرگاکانی ئاسمانیان بۆ دەکرێتەوە ، کەم کەس هەیە دوعا بکات و دوعاکەی ڕەت بکرێتەوە، کاتی بانگدان ، ڕیز وەستان لە پێناو الله دا - کاتی جیهـاد -

[ المخلصيات ٢٦٧٧ ]









## بابێك دەربارەی هۆكارەكانی قبوڵ بوونی دوعا

إبراهيم التيمى دەڵێت : كاتێک پیاو سەناو ستایشی اللەی کرد پێش دوعا کردن ئەوا بەڕاستی وەڵامی دەدرێتەوە، بەڵام کاتێک دوعای کرد پێش سەناو ستایشی الله ئەوا لەسەر ئومێدە-کە وەڵام بدرێتەوە-.

[ سنن سعيد بن منصور٦٠٤٤ ]

فضالة کوڕی عبيد الأنصاري دەڵێت: رسول الله ﷺ گوێی لەپیاوێک بوو دوعای ئەکرد لەنوێژدا ، یادی الله ی نەکرد و سەڵاواتی نەدا لەسەر رسول الله ﷺ ، رسول الله ﷺ فەرمووی : پەلەی ئەکرد ئەمە ! پاشان بانگی کرد بەوی یان بەجگە لەوی فەرموو : گەر یەکێک لەئێوە نوێژی کرد بادەست پێبکات بەسوپاس و ستایش کردنی الله، پاشان سەڵاوات بدات لەسەر پێغەمبەر ، دوای ئەوە دوعا بکات بەوەی ویستی لێیەتی.

[ مسند الإمام أحمد ٢٣٩٣٧ ]









عبد الله كوڕی مسعود دەڵێت: من نوێژم ئەكرد، پێغەمبەر ﷺ أبو بكر و عمر ی لەگەڵ بوو، كاتێک دانیشتم دەسم پێکرد بەستایش کردنی الله، پاشان سەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ ، پاشان بۆخۆم دوعام کرد ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : داوا بکە پێت ئەبەخشرێت ، داوا بکە پێت ئەبەخشرێت.

[ رواه الترمذي في سننه ٥٩٣ ]

عبد الله كوڕی مسعود دەڵێت: گەر یەكێک لەئێوە ویستی دوعا بکات، با دەس پێبکات بەسوپاس و ستایش کردنی الله بەوەی شایستەیەتی ، پاشان سەڵاوات بدات لەسەر پێغەمبەر ﷺ ، دوای ئەوە دوعا بکات، ئەوە نزیک ترە کەگیرا بێت.

[ رواه معمر بن راشد في جامعه ٢٠٥٥٠ ]

عبد الله كوڕی أبي بكر دەڵێت: ئێمە لەخەیف بووین-شوێنێکە لەمەکە- وە عبد الله کوڕی أبي عتبة مان لەگەڵ بوو، سوپاس وستایشی الله ی کرد ، پاشان سەڵاواتی دا لەسەر پێغەمبەر ﷺ ، وەچەن دوعایەکی کرد ، پاشان هەڵسا نوێژی بۆمان کرد.

[ فضل الصلاة على النبي ﷺ للالقاضي إسماعيل ٩٠ ]









الإمام الشافعي دەڵێت: هەرکەسێک بەردەوامبێت لە دوعا کردن پەیوەستبێت پێوەی وە لە دەرگا بدات ئەوە بۆی دەکرێتەوە.

[ سير أعلام النبلاء ]

أبو ذر دەڵێت: خواردن چەند پێویستی بە خوێ هەیە، ئەوەندەش نزا و دوعا پێویستت بە چاکە هەیە.

[ الزهد لابن المبارک ]

پیاویک لەدوای تەحیات وتی: {اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُکَ بِأَنَّ لَکَ الْحَمْدَ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ وَحْدَکَ لاَ شَرِیکَ لک الْمَنَّانُ بَدِیعَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، یَا ذَا الْجَلاَلِ وَالإِکْرَامِ، یَا حَيُّ یَا قَیُّومُ، إِنِّي أَسْأَلُکَ الْجَنَّةَ وَأَعُوذُ بِکَ مِنَ النَّارِ} رسول الله ﷺ بەهاوەڵانی فەرموو: ئەزانن بەچی دوعای کرد؟! وتیان: الله و پێغەمبەرەکەی زاناترن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە بەڕاستی دوعای کرد بەناوە گەورەکانی الله تعالی، ئەوناوانەی کە دوعای پێبکرێت وەڵام ئەدرێتەوە، وەئەگەر داوای پێبکرێت پێی دەبەخشرێت.

[ رواه البخاری ٢٢٧٦ ]









بۆیە لەپێش هەموو دوعاكانت تەوسول بكە بە ناوەكانی الله تعالى وە تايبەت ناوە گەورەكان -إسم الأعظم- كە لەم فەرموودەيەدا هاتوە.

رسول الله ﷺ دەفەرموویٚت: لە دوعای زوڵم لێ كراو بترسە چونكە هیچ پەردەیەک نیە لە نێوان دوعایەكە و الله- واتا ڕێک قبوڵە-.

[ رواه البخاري ٢٤٤٨ ، والمسلم ١٩ ]

رسول الله ﷺ دەفەرمویٚت: سێ دوعا ڕەت ناكرێتەوە یەكێكیان ، ئیمامی عادل ، ڕۆژەوەوان تا ڕۆژووەكەی دەشكێنێ ، سێیەم دوعای زوڵم لێ كراوە ، وە دەرگای ئاسمانەكانی بۆ دەكرێتەوە ، الله تعالى دەفەرمویٚت: بە عیزەتی خۆم سەرت دەخەم ئەگەر ئێستاش نەبێت .

[ رواه أحمد في لمسند/ والترمذي ٣٥٩٨ ]

ئیمامی عمر دەڵێت: لە دوعای زوڵم لێ كراو بترسن لەبەر ئەوەی دوعای زوڵم لێ كراو قبوڵە.

[ صحيح البخاري ٣٠٥٩ ]









## خۆت دوعا بـۆ خۆت بكە ..

عبد الله المكي دەڵێت: طاوس هاتە لام وسەردانی کردم لەنەخۆشیەکەم دا ، گوتم: ئەی باوکی عبدالرحمن لەالله بۆم بپاڕێرەوە. وتی : خۆت دوعا بۆ خۆت بکە چونکە الله وڵامی کەسی بێچارە و توش بوو بەڵا دەداتەوە.

[ تهذيب الكمال ١٣/٣٦٢ ]

أبو درداء دەڵێت: زۆر دوعا بکەن تێبکۆشن لە پاڕانەوە چونکە بێگومان هەر کەسێک زۆر بدات لەدەرگایەک، گومان دەکرێت بۆی بکرێتەوە.

[ مصنف ابن أبي شيبة ٢/٦ ]







## بابێك دەربارەی هۆكارەكانی قبوڵ نەبوونی دوعا

هۆكاری قبوڵ نەبونی دوعاكانمان بۆ چەند هۆیەک دەگەڕێتەوە،
- خواردنی حەرام

رسول الله ﷺ: باسی پیاوێکی کرد کە سەر و قژی وتێکچووە بە سەریەکدا وجلەکەی خۆڵ وتۆزاویە، ودەستی بەرز دەکاتەوە بەرەو ئاسمان، ودەڵێت: ئەی پەروەردگار (یا رب)، ئەی پەروەردگار (یا رب)، خواردنەکەی حەرامە، وخواردنەوەکەی حەرامە، وجلەکەی حەرامە، وخواردنی حەرامی پێدراوە، چۆن وەڵامی ئەو جۆرە کەسە دەدرێتەوە؟!

[ صحيح المسلم ]

بەداخەوە ئێستا ئەهلی سونەیە و گوێ نادات بەوەی کە دەیخوات کێ سەریبڕیەوە لە هەرشوێنەکەوە سەربڕاو بێت دەیخوات، پاشان گلەی ئەوە دەکات دوعاکانی قبوڵ نابن و ژیانی لە نارەحەتیدایە.!!











## پەلەکردن لە دوعادا بەوەی زوو جواب بدرێیتەوە

رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێت : وەڵامی دوعاكانی هەریەک لە ئێوە دەدریتەوە مادام پەلە نەکەن، دەڵێت : داوام کرد لە پەروەردگارم، بەڵام وەڵامی نەدامەوە. ، لە ڕیوایەتەكەی { مسلم } دەڵێت : یا رسول الله چۆنە پەلەکردن؟ فەرمووی ﷺ : دەڵێت : بەڕاستی دوعام کرد، بەڕاستی دوعام کرد، بەڵام نەمبینی جوابم بدرێتەوە، وە ماندوو دەبێت لەگەڵ ئەمەدا و واز لەدوعا کردن دەهێنێت.

[ متفق علیه ]

## کافربون و موشریک بوون

الله تعالى دەفەرمووێت : {فَادْعُوا وَمَا دُعَاءُ الْكَافِرِينَ إِلَّا فِي ضَلالٍ}

[ غافر ٥٠ ]

واتە : دوعا بکەن و داوا بکەن، وە دوعا و داواکردنی کافران گومڕایی و وێڵی نەبێت هیچی تر نیە.









إبرِاهیم كوڕی أدهم : تێدەپەڕێت بەلای بازاڕی بەصرا، خەڵكی لێی كۆ بوونەوە پێیان ووت: ئەی باوكی إسحاق: چیمان بەسەر هاتووە دوعا دەكەین وەڵاممان نادرێتەوە!

فەرمووی: چونكی دڵەكانتان مردووە بە دە دانە هۆكار، ووتیان: چییە؟

فەرمووی :

١- ئێوە اللەتان ناسی، بەلام حەقی اللەتان نەدا.

٢- گووتان و واتان دانا كەوا پێغەمبەری اللەتان ﷺ خۆشدەوێت، بەڵام وازتان هێنا لە سوونەتەكەی.

٣- قورئانتان خوێند، بەلام كارتان پێی نەكرد.

٤- لە نیعمەتەكانی اللەتان خوارد، بەلام شوكر و سوپاسی اللەتان نەكرد لەسەری

٥- بە ئێوەمان گووت كەوا شەیتان دوژمنی ئێوەیە، بەلام ئێوە ڕەزامەندبوون بە شەیتان

٦- بە ئێوەمان گووت كەوا بەهەشت حەق و ڕاستییە، بەلام كارتان بۆی نەكرد

٧- بە ئێوەمان گووت كەوا جەهەنەم حەق و ڕاستییە، بەڵام ئێوە لێی دوورنەكەوتنەوە و ڕاتان نەكرد لێی









٨- به ئێوەمان گووت کەوا مردن حەقە، بەڵام ئێوە ئامادە کاریتان بۆی نەکرد

٩- ئێوەمان لە خەو بەئاگا هێنا، بەڵام ئێوە سەرقاڵ بوون بە عەیب و عارِی خەڵک، وازتان لە عەیب و عارِی خۆتان هێنابوو

١٠- مردووەکانی خۆتانتان ناشت، بەڵام پەند و ئامۆژگاریتان وەرنە گەرت.

[ جامع بيان العلم وفضله ]

أبو بكر الصديق دەڵێت: فەرمان ئەکەن بەچاکە و رِێگری ئەکەن لەخراپە، ئەگەر نا اللّٰہ تعالی خراپترین کەسەکانتان بەسەرەوە دەست رِۆیشتوو دەکات لەپاشانیش باشەکانتان دوعا دەکەن کەچی وەڵامیان نادرێتەوە، سوێند بە اللّٰہ فەرمان ئەکەن بەچاکە و رِێگری ئەکەن لە خراپە، ئەگینا بەدڵنیایی و بێ گومان اللّٰہ تعالی سزاتان ئەدات .

[ موسوعة ابن أبي الدنيا ]

وهب کورِی منبە دەڵێت: نموونەی ئەو کەسەی کە بەبی ئەوەی کرداری چاکە بکات بەس دوعا دەکات، وەک نموونەی کەسێکە کە تیر دەهاوێژێت بە کەوانێک کە پەتەکەی پێوە نیە.

[ الزهد لإبن المبارک ٣٢٢ ]









## دوعاكانى ناو قورئان

{ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ } [البقرة ١٢٧ ]

{ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ }
[ البقرة ٢٠١ ]

{ رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ }
[ البقرة ٢٥٠ ]

{ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنْتَ مَوْلَانَا فَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ }
[ البقرة ٢٨٦ ]

{ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ } [ آل عمران ٨ ]

{ رَبَّنَا إِنَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ } [ آل عمران ١٦ ]

{ رَبِّ هَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ }
[ آل عمران ٣٨ ]









{ رَبَّنَا آمَنَّا بِمَا أَنْزَلْتَ وَاتَّبَعْنَا الرَّسُولَ فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ }
[ آل عمران ٥٣ ]

{ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِي أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ } [ آل عمران ١٤٧ ]

{ حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ } [ آل عمران ١٧٣ ]

{ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ } [ آل عمران ١٩١ ]

{ رَبَّنَا إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلْإِيمَانِ أَنْ آمِنُوا بِرَبِّكُمْ فَآمَنَّا رَبَّنَا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّئَاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ الْأَبْرَارِ } [ آل عمران ١٩٣ ]

{ رَبَّنَا وَآتِنَا مَا وَعَدْتَنَا عَلَى رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ الْمِيعَادَ } [ آل عمران ١٩٤ ]

{ وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ وَلِيًّا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيرًا } [ النساء ٧٥ ]

{ وَارْزُقْنَا وَأَنْتَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ } [ المائدة ١١٤ ]

{ رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنْفُسَنَا وَإِنْ لَمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ }
[ الأعراف ٢٣ ]











﴿ رَبَّنَا افْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِالْحَقِّ وَأَنْتَ خَيْرُ الْفَاتِحِينَ ﴾ [ الأعراف ٨٩ ]

﴿ رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ ﴾ [ الأعراف ١٢٦ ]

﴿ فَلا تُشْمِتْ بِيَ الْأَعْدَاءَ وَلَا تَجْعَلْنِي مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴾ [ الأعراف ١٥٠ ]

﴿ وَأَدْخِلْنَا فِي رَحْمَتِكَ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ ﴾ [ الأعراف ١٥١ ]

﴿ أَنْتَ وَلِيُّنَا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنْتَ خَيْرُ الْغَافِرِينَ ﴾ [ الأعراف ١٥٥ ]

﴿ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ * وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴾ [ يونس ٨٥/٨٦ ]

﴿ فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَنْتَ وَلِيِّي فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ ﴾ [ يوسف ١٠١ ]

﴿ رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلاةِ وَمِنْ ذُرِّيَّتِي رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاءِ ﴾ [ إبراهيم ٤٠ ]

﴿ رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ ﴾ [ إبراهيم ٤١ ]

﴿ رَبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا ﴾ [ الإسراء ٢٤ ]









{ رَبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَاجْعَلْ لِي مِنْ لَدُنْكَ سُلْطَانًا نَصِيرًا } [ الإسراء ٨٠ ]

{ رَبَّنَا آتِنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا } [ الكهف ١٠ ]

{ رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي * وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي } [ طه ٢٥/٢٦ ]

{ رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا } [ طه ١١٤ ]

{ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ } [ الأنبياء ٨٧ ]

{ رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنْتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ } [ الأنبياء ٨٩ ]

{ رَبِّ أَنْزِلْنِي مُنْزَلًا مُبَارَكًا وَأَنْتَ خَيْرُ الْمُنْزِلِينَ } [ المؤمنون ٢٩ ]

{ رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ * وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَنْ يَحْضُرُونِ } [ المؤمنون ٩٧/٩٨ ]

{ رَبَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنْتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ } [ المؤمنون ١٠٩ ]

{ رَبِّ اغْفِرْ وَارْحَمْ وَأَنْتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ } [ المؤمنون ١١٨ ]









{ رَبَّنَا اصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا * إِنَّهَا سَاءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا } [ الفرقان ٦٥/٦٦ ]

{ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا } [ الفرقان ٧٤ ]

{ وَاجْعَلْ لِي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ * وَاجْعَلْنِي مِنْ وَرَثَةِ جَنَّةِ النَّعِيمِ } [ الشعراء ٨٤/٨٥ ]

{ وَلَا تُخْزِنِي يَوْمَ يُبْعَثُونَ * يَوْمَ لَا يَنْفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ * إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ } [ الشعراء ٨٧/٨٩ ]









# دوعاكانی ناو فەرموودە

- اللَّهُمَّ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ.

[ صحيح البخارى ]

- لَا إِلَهَ إِلَّاالله الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَرَبُّ الْأَرْضِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ. [ رواه المسلم ]

- اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي، وَعَافِنِي، وَارْزُقْنِي. [ رواه المسلم ]

- اللَّهُمَّ إني ظلمت نفسي ظُلمًا كثيرًا، ولا يغفر الذُّنوب إلا أنت، فاغفر لي مغفرةً من عندك وارحمني إنك أنت الغفور الرحيم.

[ رواه البخارى ]

- اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ القَبْرِ، وَمِنْ عَذَابِ النَّارِ، وَمِنْ فِتْنَةِ المَحْيَا وَالمَمَاتِ، وَمِنْ فِتْنَةِ المَسِيحِ الدَّجَّالِ. [ رواه البخارى ]

- اللَّهُمَّ اهدني وسددني، اللهم إني أسألك الهدى والسداد.

[ رواه المسلم ]









- اللَّهُمَّ إني أعوذ بک من زوال نعمتک، وتحول عافيتک، وفجاءة نقمتک، وجميع سخطک. [ رواه المسلم ]

- اللَّهُمَّ اللَّهُمَّ برحمتک أرجو فلا تکلني إلى نفسي طرفة عين، وأصلح لي شأني کله، لا إله إلا أنت. [ رواه أبو داود ]

- اللَّهُمَّ إني أعوذ بک من البخل، وأعوذ بک من الجبن، وأعوذ بک من أن أُرد إلى أرذل العمر، وأعوذ بک من فتنة الدنيا يعني فتنة الدجال، وأعوذ بک من عذاب القبر. [ رواه البخارى ]

- اللَّهُمَّ إني عبدک ابن عبدک، ابن أمتک، ناصيتي بيدک، ماضي فيّ حکمک، عدل في قضاؤک. أسألک بکل اسم هو لک سميت به نفسک، أو أنزلته في کتابک، أو علمته أحداً من خلقک، أو استأثرت به في علم الغيب عندک، أن تجعل القرآن ربيع قلبي، ونور صدري، وجلاء حزني، وذهاب همي. [ مسند إمام أحمد ]

- رب أعني ولا تعن علي، وانصرني ولا تنصر علي، وامکر لي ولا تمکر علي، واهدني ويسر الهدى إلي، وانصرني على من بغى علي، رب اجعلني لک شکاراً، لک ذکاراً، لک رهاباً، لک مطواعاً، إليک مخبتاً أواهاً









منيباً، رب تقبل توبتي، واغسل حوبتي، وأجب دعوتي، وثبت حجتي، واهد قلبي، وسدد لساني، واسلل سخيمة قلبي. [ رواه الترمذي ]

- اللَّهُمَّ إني أعوذ بک من الكسل والهرم والمأثم والمغرم، ومن فتنة القبر ومن فتنة النار وعذاب النار ومن شر فتنة الغنى، وأعوذ بک من فتنة الفقر، وأعوذ بک من فتنة المسيح الدجال , اللهم اغسل عني خطاياي بماء الثلج والبرد، ونق قلبي من الخطايا كما نقيت الثوب الأبيض من الدنس، وباعد بيني وبين خطاياي كما باعدت بين المشرق والمغرب. [ رواه البخارى ]

- اللَّهُمَّ لَکَ أسْلَمْتُ وبِکَ آمنْتُ، وعليکَ توَكَّلْتُ، وإلَيکَ أنَبْتُ، وبِکَ خاصَمْتُ، اللّهمَّ أعُوذُ بِعِزَّتِک، لا إلَه إلاَّ أنْتَ أنْ تُضِلَّنِي أنْت الْحيُّ الَّذي لا تمُوتُ ، وَالْجِنُّ وَالإنْسُ يمُوتُونَ. [ متفق عليه ]

- اللَّهُمَّ إني أسألک الهدى والتقى والعفاف والغنى. [ رواه المسلم ]

- اللَّهُمَّ اهدني وسددني واذكر بالهدى هدايتک الطريق والسداد سدادک السهم. [ رواه المسلم ]









- اللَّهُمَّ مصرف القلوب صرف قلوبنا على طاعتک. [ رواه المسلم ]

- اللَّهُمَّ إني أعوذ بک من الشقاق والنفاق وسوء الأخلاق.

[ رواه المسلم ]

- لا إله إلا أنت سبحانک إني كنت من الظالمين. [ رواه الترمذي ]

- يا مقلب القلوب ثبت قلبي على دينک. [ رواه الترمذي ]

- اللَّهُمَّ إني أعوذ بک من شر سمعي، ومن شر بصري، ومن شر لساني، ومن شر قلبي، ومن شر منيي. [ رواه الترمذي ]

- اللَّهُمَّ اغفر لي ذنبي كلَّه؛ دِقَّه وجِلَّه، وأوله وآخره، وعلانيته وسره.

[ رواه المسلم ]

- اللَّهُمَّ إني أسألک فعل الخيرات، وترک المنكرات، وحب المساكين، وأن تغفر لي، وترحمني، وإذا أردت فتنة قوم فتوفني غير مفتون، وأسألک حبک، وحب من يحبک، وحب عمل يقربني إلى حبک

[ رواه أحمد ]









- اللَّهُمَّ إني أعوذ بك من منكرات الأخلاق، والأعمال، والأهواء.

[ رواه الترمذي ]

- اللَّهُمَّ إني أعوذ بك من البرص، والجنون، والجذام، ومن سيئ الأسقام. [ رواه أبو داود ]

- اللَّهُمَّ اغفر لي خطيئتي، وجهلي، وإسرافي في أمري، وما أنت أعلم به مني، اللهم اغفر لي هزلي وجدي، وخطئي وعمدي، وكل ذلك عندي. [ رواه البخاري ]

- اللَّهُمَّ اني اعوذ بك مِنْ جَهْدِ البَلاءِ، وَدَرَكِ الشَّقَاءِ، وَسُوءِ القَضَاءِ، وَشَمَاتَةِ الأَعْدَاءِ. [ رواه البخاري ]

- اللَّهُمَّ أصْلِحْ لِي دِينِي الَّذِي هُوَ عِصْمَةُ أَمْرِي، وَأَصْلِحْ لِي دُنْيَايَ الَّتِي فِيهَا مَعَاشِي، وَأَصْلِحْ لِي آخِرَتِي الَّتِي فِيهَا مَعَادِي، وَاجْعَلِ الحَيَاةَ زِيَادَةً لِي فِي كُلِّ خَيرٍ، وَاجْعَلِ المَوتَ رَاحَةً لِي مِنْ كُلِّ شَرٍّ. [ رواه المسلم ]

- اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا، وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيرُ مَنْ زَكَّاهَا، أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَولاهَا، اللَّهُمَّ إنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لا يَنْفَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لا يَخْشَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لا تَشْبَعُ، وَمِنْ دَعْوَةٍ لا يُسْتَجَابُ لَهَا. [ رواه المسلم ]









- اللَّهُمَّ إنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَاعَمِلْتُ، وَمِنْ شَرِّ مَا لَمْ أَعْمَلْ.

[ رواه المسلم ]

- اللَّهُمَّ إني أعوذ بك من العجز، والكسل، والجبن، والبخل، والهرم، وعذاب القبر. [ رواه المسلم ]

- اللَّهُمَّ اجعل في قلبي نورًا، وفي بصري نورًا، وفي سمعي نورًا، وعن يميني نورًا، وعن يساري نورًا، وفوقي نورًا، وتحتي نورًا، وأمامي نورًا، وخلفي نورًا، واجعل لي نورًا. [ رواه البخارى ]

- اللَّهُمَّ أحيِني ما كانت الحياة خيرًا لي، وتوفَّني إذا كانت الوفاة خيرًا لي. [ رواه البخارى ]

- ا اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ كُلُّهُ وَبِيَدِكَ الْخَيْرُ كُلُّهُ وَإِلَيْكَ يَرْجِعُ الْأَمْرُ كُلُّهُ وَأَنْتَ إِلَهُ الْخَلْقِ كُلِّهِ نَسْأَلُكَ مِنَ الْخَيْرِ كُلِّهِ وَنَعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّرِّ كُلِّهِ.

[ مصنف ابن أبي شيبة ]

- اللَّهُمَّ اجْعَلْنَا نُحِبُّكَ ، وَنُحِبُّ مَلائِكَتَكَ , وَأَنْبِيَاءَكَ وَرُسُلَكَ ، وَنُحِبُّ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ , اللَّهُمَّ حَبِّبْنَا إِلَيْكَ , وَإِلَى مَلائِكَتِكَ , وَإِلَى أَنْبِيَائِكَ وَرُسُلِكَ , وَإِلَى عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ. [ مسائل أبي داود ]









# کۆتای

اللَّهُمَّ

گەر نیعمەتی دوعا نەبوایە کە بەخشیوتە بەبەندەکانت، هەرکات بمانەوێ گوێمان بۆدەگری ودڵسۆز ترینمانی وبیسەری راز و ئەسراری دڵەکانمانی وئارامی ئەدەی بەدڵەی بێ ئارامان ودڵەی لاوازمان لەکاتێکدا سەختی دەوری داوین، بۆیە هەرکەس دوعای کرد و وای گومان برد کە پەروەردگاری بە دەستی خاڵی دەیگێڕێتەوە، ئەوە قەت پەروەردگاری نەناسیوە.

الحمدلله الذي بنعمته تتم الصالحات

مەڕوان تۆفیق

٩ شەوال/١٤٤٤ هـ



